ئەحمەدی موفتی زادە

# کوفر و ئیمان
# و
# سیاسەتی نێو نەتەوەیی ئیسلام



ئامادەکردنی

فیصل ابراهیم ولي

بەناوی خودای بەخشندە و میهرەبان

فقط نابێ کە دەرکی کول نەبوو یەك پارچە تەرکی کول

بە باغێکە لەکن بولبول گوڵێ لەو باغ و بوستانە

مەحوی

# لەباتی پێشەکی

خوێنەری بەڕێز ئەم نامیلکەیەی لەبەردەستتدایە هەوڵێکی ڕاستەقینەی (کاک ئەحمەدی مفتی زادە)یە دەکرێت کار لەسەرکردنی ئەم جۆرە بۆ چونانە هۆکارێك بن بۆ ڕێگرتن لە ململانێ و بەیەکداچونی ئاین و ئایدۆلۆجیا و دواجار نەتەوەکانیش کۆمەڵگاش لەم کارە ترسناکە بپارێزێت.

ئەگەر لەبابەتی پلۆرالیزمی ئاینیدا تاکەکانی هەر کۆمەڵگایەك دابەش بکەین ئەوا لەم سێ گروپە تێناپەڕێت:

1/ ئەوانەی کەوادەزانن ڕاستی ڕەها لای ئاینەکەی ئەوانە و هیچ ڕێژەیەك ڕاستی لە ئاینەکەی بەرامبەردا وێنا ناکەن.

2/ ئەوانەی ڕاستی ڕەها لە ئاینێکدا دەبینن و ڕێژەیەك ڕاستی لە ئاینی بەرامبەردا وێنادەکەن.

3/ ئەوانەی کەوادەزانن ڕێژەی ڕاستی لەهەموو ئاینەکاندا وەك یەك وایە.

ئەوەی مفتی زادە لێرەدا ئەیەوێت بیخاتەڕو هەمان بۆ چوونی گروپی دووهەمە کەئەم زۆر تایبەتمەندتر لەهەر بیریارێکی تر بە پشت بەستن بەقورئان و سونەت بۆ چوونی تایبەتی خۆی هەلگۆزیووە بەگوتەی خۆی ( مرۆڤ دەبێت خۆی دراسەی وردی قورئان بکات و پاشان بەپێی تێگەیشتنی خۆی تێگەیشتنێکی ڕاست و دروستی لێ هەلگۆزێت) کە ئەمەش دەبێتە هۆی گۆڕانی ئادەمیزاد بۆ قۆناغی مرۆڤایەتی هەروەك تیۆریایی چوار جەبری (د.شەریعتی).

وە هەروەها شێوازێکە لەو هەوڵەی کە (مەحوی) دابووی بۆ بەخشینی سیفاتی کەشفکاری بۆ شتەکان کاتێك پێش ئەو سیفاتی کەشفکاری تەنها بەنور دەدرا, مەحوی هات لەگەڵ ئەم نورەدا هەمان سیفاتی بەخشی بە شەویش. (شەو نەبێت ئەستێرە مەستورن بەکەم مەڕوانە شەو)

**تێبینی:** ئەمە دەقی وتارێکی کاك ئەحمەدی موفتی زادەیە لە بارەی (کوفر و ئیمان

و سیاسەتی نێونەتەوەیی ئیسلام) کە لەزمانی نوسینەوە بە یارمەتی خوا خستمانە سەر کاغەز بە دەستکاری زمانەوانی و پوختکردنەوەی بۆ زمانی نوسین کە لەلایەن گۆڤاری (هەژان)ەوە پێداچونەوەی بۆ کراوە و پاشان لە ژمارە 20ی هەمان گۆڤاردا بڵاوکرایەوە.

فەیصەڵ ئیبراهیم
هەڵەبجەی شەهید
2007/10/19

## بەناوی خودای بەخشندە و میهرەبان

بەرێز كاك ئەحمەد ماوەیەكە دەمەوێت ئەوە بڵێم كە لە كۆمەڵێك كاسێت و لە چەند شوێنێكی تردا بیستوومە كە ئاماژەتان بەوە داوە كە ئێستا لە دونیادا ناتوانم یەكێك بدۆزمەوە كە پێی بڵێم بێبڕوا و كافرە. لەكاتێكدا لەسەردەمی پێغەمبەردا (د.خ) و لەدوای ئەو و لەسەردەمی خەلیفەكانی راشیدیندا چەندین جەنگی جیاواز ڕووی داوە بەنێوی بنەبڕكردنی كوفرەوە و لەسەردەمی خەلیفە ئەبوبەكردا (ر.خ) سەبارەت بەو كەسانەی كە دەیانووت زەكات نادەین بەڵام باقی دەستوورەكانی تری ئیسلام ئەنجام دەدەین, ئەمەش بووە هۆی ئەوەی خەلیفە ئەبوبەكر لە دژیان جەنگ و جیهادی بەرپاكرد و تەنانەت ووتیشی بە موسڵمانەكان كە ئەگەر بێت و ئەوانیش لەگەڵیدا شەڕی هەڵگەڕاوەكان نەكەن ئەوا ئەو خۆی بە تەنهاش بێت دەچێتە مەیدانی جەنگ و ڕووبەڕوویان دەوەستێت. ئایا ئەمەش لەگەڵ

ئەوەی پێشوودا کە وەبیری جەنابتانم خستەوە جۆرێك لە پێچەوانەبوون و دژهاتنەوەی پێوە دیار نیە؟.

## بەناوی خودای بەخشندە و میهرەبان

ئەم بابەتەی لەم پرسیارەدا خرایە ڕوو بەشێکە لەبابەتێکی فراوانتر کە بریتیە لە (سیاسەتی نێونەتەوەیی ئیسلام) و پێشتر زۆر بەکورتی لە پەراوێزێکدا بۆ کتێبی (لەبارەی کوردستانەوە) لەبارەی برێك لە (بنەماکانی سیاسەتی ئیسلامەوە) چ سیاسەتی ناوخۆیی چ سیاسەتی نێونەتەوەیی, ڕوونکردنەوەم کردووە, جانازانم بەرێزتان ئەوەتان خوێندوتانەتەوە یان نا, هەڵبەت زۆریش ناچێتە چوارچێوەی ڕوونکردنەوەوە, بەڵکو ئاماژەیەکە کە ئەگەر ڕوونکردنەوەی لەسەر بدرێت زۆر درێژخایەن دەبێت چونکە لەوکاتەوە کە حکومەتی ڕاوێژ (شوری) لەنێو چوو حکومەتی (إستبدادی فەردی- ستەمکاری تاکە کەسی) دامەزرا لەجیهانی ئیسلامیدا, ئەوەی کە نێوی سیاسەتی

ئیسلامی بوو فەرمانڕەوایی نەما- مەبەستم ئەوە نیە کە هەر بەگشتی نەما.

واتە لەسەر بنەمای سیاسەتی ئیسلامی نەبوو کە حکومەتی (ستەمکاری) بەخۆی و هاوفیکر و لایەنگرەکانیەوە بە هەر جۆرێك ئارەزووی بووایە حوکمی دەکرد, هەر چەندە لەوانەیە جارجاریش کۆك و هاوتا بوو لەگەڵ ئیسلامیشدا, بەڵام ئەگەر پێچەوانەی ئیسلامیش بووایە کاری نەبوو چونکە سروشتی حکومەتی (ستەمکاری) وایە, لەبەر ئەو دەسەڵات نەمانە دەبینین هەر چەندە هەندێك بابەتی فیقهی گەلێك زۆر باسکراوە بەڵام بابەتی سیاسەتی ئیسلامی ئێجگار بە باس نەکراوی ماوەتەوە, ئەگەر جاروبار بەکردەوە یان بە قسە بابەت گەلێك لەم زەمینەدا هاتبێتە پێش, لەڕووی پێکهاتەوە دابڕاون لەیەك و نەبەستراونەتەوە بەیەکەوە ئەوانەش کە لە سەدا سەد و بەپێی دیسپلینی ئیسلامی بووە ئیدی چ ناوخۆیی چ نێونەتەوەیی بۆ کەسانێك کە گەلێك ئەهلی

لێکۆڵینەوە و خوێندنەوە نەبن و شارەزا نەبن لەقورئاندا هێشتا هەر شاراوە و نادیارە. بۆ نموونە ڕاپەڕینێك لەلایەن خودی بنەماڵەی نوور و پەیامەوە دەکرێت وەك ڕاپەرینی حسێن (ر.خ) لەڕووداوی کەربەلادا, کەسێك بەدواداچوونی ببێت لە قورئاندا ناکەوێتە شوێن ئەوە چی دەووترێت و چی دەگوێزرێتەوە ئەوە بکات بە بنەما بۆ بیرکردنەوەی. نا بەڵکو دەبێت ڕووداوەکە لەکۆی گواستنەوە و ڕیوایەتەکان بەدەست بێنێت, لە ڕاستیشدا میتۆد و ڕێبازی دروستیش بۆ ئەوەی باش لە مێژوو تێبگەین ئەوەیە کە نەکەوینە شوێن هیچ کەسێك یان ڕیوایەتێك بەتەنیایی و بەڵکو کۆی نەقڵ و ڕیوایەتە کۆك و جیاوازەکان بەهەند وەربگرین و بەتێگەیشتنی خۆمان بزانین بڕێك هاوتایی و هاوسەنگی, یان لەمەش کەمتر مەبەستێك بەدەست بێنین و تێبگەین و لەسەر بنەمای ئەمە ڕووداوەکان لێك بدەینەوە, ئەگەر نا ئێمە لەسەر بنەمای (نقل) گەلێکی جیاواز, کە مرۆڤ

پێشکەشی هەر ڕووداوێکی مێژوویی بکات ئیدی هەر ڕووداو و کارەساتێکی گەورەی مێژوویی بێت ئەوا دوچاری هەڵەکردن دەبێت. با لێرەدا ئاماژەیەك بکەم بە باسێکی زۆر درێژخایەن کە پێویستی بەکاتێکی درێژ هەیە و بە پشتیوانی خودای گەورە دەمەوێت بابەتەکە شیبکەمەوە و بەڵام لێرەدا تەنها ئاماژە بە بابەتێکی وەك بابەتی (سیرە و ریوایات) دەکەم, بەوجۆرەی کە زۆرجار ئەهلی زانست لەم سەدەی ڕابردوودا لەگەڵ ئەم دوو بابەتەدا ڕووبەڕوو بوونەتەوە ئەوا نامانگەیەنێتە ئەنجامێکی دروست زۆربەی جاریش کەوتوونەتە هەڵەوە, هەڵەی ئێجگار گەورەش. بۆ کەسێك شارەزا بێت لەقورئان ئاراستە دەکرێت, لەڕاستیدا هەڵەگەلێکی گەورەیە, بەڵام ئەگەر بەپێی ئەو ڕێبازەی من دەیلێم خوێندنەوەیان بکردبایە لە باسگەلێکی کۆك و جیاواز لەهەر شتێك پەیوەندی هەیە بەو ڕێبازەوە, بۆ نموونە ڕێباز و (سیرە)ی خودی پێغەمبەر (د.خ) سەبارەت بە بابەت گەلێکی

جیاواز ئەمە لەکوێ ئەم شت گەلە کەماوەتەوە ڕۆحێکی تێگەیشتنیان هەڵبگۆزیبایە دەیانزانی چەندێك لەم ڕیوایەتانە کە لە (سیرە)دا هاتووە دروستە و چەندیشی نادروستە, بەڵام کاتێك مرۆڤ تەنها دەقی ئەم ڕیوایەتە سەیردەکات بەڕاستی دەکەوێتە ناو بومەلێڵی و تاریکیەکی نادیارەوە کە لە ڕاستیدا واقعیەتەکەی بۆ ڕوون نابێتەوە, بەڵێ بەڕاستی ڕەوشتی پێغەمبەر (د.خ) لەم بابەتەدا وا بەوجۆرەی (سیرە) باسی دەکات چۆن بووە؟ چونکە گێڕانەوەی جیاواز هەیە هەندێك بەجۆرێك باسی دەکەن و هەندێکی تریش جۆرێکی تر باسی لێوەدەکەن. هەروەها (فەرموودە)ش ئەگەر بڕیار بێت هەرکەسێك هەرچی فەرموودە کەوتووەتە دەستی بەبێ ئەوەی بزانێت لە ڕاستیدا پێغەمبەر (د.خ) چی فەرمووە, دوچاری لادان دەبێت کە دوورە لە ڕێگەی ڕاستەقینەی ئیسلام, کە ڕێگەی قورئان و سوننەتی پێغەمبەرە (د.خ) چ بەگوتە چ بەکردەوە چ شێوازی ڕوونکەرەوەی قورئانە بۆ

ئەوەی قورئان ڕوون بکاتەوە بۆ خەڵکی لەکاتێکدا ئەگەر هەم لە(سیرە)دا و هەم لە (فەرموودە)دا مرۆڤ بکەوێتە شوێن ئەم ڕێگەیە واپێشنیار دەکەم و لەهەر ڕووداوێکی دیکەدا ڕووداوی زەمان و کاتە جیاوازەکان پەیوەندیدار بە ئیسلام و غەیرە ئیسلام, ئەوەی ڕێبازی واقعیەت ناسی سەبارەت بە ڕووداوی چ هاوزەمانی خۆت یان ڕابردوو, هەر ئێستا سەبارەت بە ڕووداو گەلێکی هاوزەمانی خۆت بۆ پەیبردن بە واقعیەت دەبێت ئەوەندە خوێندنەوەت هەبێت لە بۆچوون و بیروڕای جیاواز تا تۆ سیمایەکی حەقیقی و واقیعی بەڵام دیاریکراو و بچووك لەو بابەتەدا, لەو بابەتەدا کە دەیخوێنی ئەوە بەدەستی بهێنیت و تێبگەیت ئیتر لەمەودوا هەرچی شتە هەڵی بسەنگێنیت, لەسەر بنەمای ئەوە بۆت دەردەکەوێت کامەی ڕاست و دروست و کامەشی دروست نییە, تۆ بە بۆنەی خوێندنەوەی جیاوازەوە لە (سیرە)دا گشتگیریەکی دروست و ڕاست لە ئەخلاق و

ڕەوشتی پێغەمبەر (د.خ) دێتە دەستت, ئەگەر ئەوەت هاتە دەست ئیتر باش دەتوانیت تێبگەیت ئەوەی لە کتێبەکانی (سیرە)دا وتراوە چەندێکی دروستە و چەندێکیشی نادروستە هەر هەمان چەشنەش لە فەرموودەکانیشدا. ئەمە تەنها ئاماژەیەکە بۆ ئەوە کە خودی ئەم بابەتە, بابەتێکە لەچەند بابەتێکی گرنگ, کە ئەگەر خودا یار بێت شی دەکەینەوە. مەسەلەی سیاسەتی ئیسلامیش هەر بەم شێوازە پێویستە مرۆڤ بەپشتیوانی (قورئان)ەوە لێی تێبگات, پشتیوان بوونی قورئان بۆ سیاسەتی ئیسلامی بەهێزترە, وەکو (فەرموودە) و (سیرە) نیە, چونکە (قورئان) لەبارەی ئەوەوە کە پێغەمبەر (د.خ) چی دەفەرموویێت شتێك ناگێڕێتەوە مەگەر ناواز (إستثناء) بێت. ڕستە گەلێك یان لەبارەی ئەوەی ڕەوشتی پێغەمبەر (د.خ) چۆن بووە هیچ نالێت مەگەر ئاماژەیەك بێت بە خوو و ڕەوشتی پێغەمبەر (د.خ), بەڵام لەبابەتی سیاسەتدا ڕێبازەکەی قورئان دیاری دەکات,

زۆر جیاوازی هەیە لەبابەتی تر, هەر لەبەر ئەوەشە ئاسانتر لەوەی کە مرۆڤ لە (سیرە) و لە (فەرموودە)دا بتگەیەنێتە شتێکی گەڵاڵەبووی دروست لەو حەقیقەتە لە مەسەلەی سیاسەتدا. چونکە بنەمای گشتی ڕێبازەکە هەمووی لەقورئاندا بەیانکراوە, بەتایبەتی سیاسەتی (نێونەتەوەیی) لەوەوە دوابنەمای گشتیش لەم ڕێبازە بەدرێژی یان بەپوختی ڕایگەیاندراوە. بەم بەڵگەیە لە مەسەلەی سیاسەتدا مرۆڤی لێکۆڵەر باشتر بە پشتیوانی قورئان دەتوانێت ئەو ڕێبازە بەکاربهێنێت تا ببێتە ڕوانگەی سیاسەتی ئیسلام لە سەردەمی حکومەتی ئیسلامیدا واتە هەر ئەو بابەتە ئێوە هەڵتان بژاردووە بۆ داواکاریەکە, کە سەردەمی پێغەمبەر (د.خ) و لەسەردەمی خەلیفەکانی ڕاشیدیندا و بەتایبەتی تر لەسەردەمی خەلیفە ئەبوبەکردا (ڕ.خ), ئەگەر خوێندنەوەی بۆ بکرێت زۆر باش دەتوانرێت دەرکی بکرێت هەر لە بنەڕەتیشدا جەوهەری شتەکە چۆن بووە, و دەتوانرێت ڕوخساری راستەقینە و دروست لە

جەوهەری ئەم بابەتە, کە بریتیە لە (سیاسەتی نێونەتەوەیی ئیسلام) بەدەست بهێنرێت, هەڵبەت ناوخۆییش, بەڵام زیاتر مەسەلەی (نێونەتەوەیی)ەکەیە بەزۆرتر لە ئێستادا, چونکە ئەم ڕێبازە هێندە بەکارنەبراوە و هەر بەهەمان چەشن کە پێشتر ئاماژەمان پێدا, مەوزوعیەتی نەماوە حاڵەتی کارپێکردنی نەماوە, لە سیاسەتی ئیسلامیدا کۆمەڵە لێکۆڵینەوەیەك دەبینیت لە چەند کتێبێکی جیاوازدا زۆر سیاسەتی ئیسلام بۆ مرۆڤ ڕوون ناکەنەوە و تەنانەت لەم سەردەمانی کۆتاییەدا کە چەند بزوتنەوە و بزاڤێکی ئیسلامی لە جێگە جیاوازەکاندا بەنزیکەیی لەم چەند دەیەی کۆتاییدا (80-100) ساڵێکە زۆر دەرکەوتوون و خەباتێکی زۆر دەکرێت و زانایان زۆر سەرنجیان لەم بابەتەداوە و باسی لێدەکەن هێشتا سەیر دەکەین شتێك زۆر باش و وروژێنەر لەبارەی سیاسەتی ئیسلامیەوە نایەتە دەست, بەم بەڵگەیەوە ئەگەر بمەوێت وەڵامێك زۆر تەواو و پێگەیوو بۆ بابەتی

پرسیارەکە کە ناونیشانەکەی دەبێتە (جەنگی نێوان ئیسلام و کوفر) کە لە بنەڕەتیشدا جەنگێك لەنێوان ئیسلام و کوفردا بوونی نییە, بمەوێت بەدرێژی باس بکەم ئەوا زۆر درێژە دەکێشێت, و ئێستەش باوەڕناکەم ئەو ئامادەیەم هەبێت کە هەروا بێ بیرکردنەوە و بێ دووبارەکردنەوەی نوێی قورئان تەواو ئەو داواکاریە ئەدا بکەم بەڵام لەبەر گرنگی بابەتەکەش حەیفم لێدێت کە شتێکی ڕوونتر لەمبارەیەوە باس نەکەم بەشێوەیەك ئەگەر کەسێك ئەم وەڵامەی بیست بتوانێت وەها تێگەشتنێکی دروست لە سیاسەتی (نێونەتەوەی ئیسلام) تێبگات لەو سنووڕەدا پێویستە برێك ڕوونکردنەوە بدەم. ڕێبازی گشتی و دروست بەوجۆرە لەئاست پێشنیاری پرسیارەکەتاندا بوو, ڕوونکردنەوەی زۆرم داوە لەبارەی (ئیمان و کوفر)ەوە و سەبارەت بە بەرامبەر بوونی ئەم دووانە دا, لە ڕاستیدا (ئیسلام و کوفر) لەبەرامبەر یەکدیدا نین, ڕوونکردنەوەی زۆرم داوە و نووسیوە, کوفر

بریتینیە لەموسڵمان نەبوون, لە زاراوەی مەنتیق و لۆژیكدا دوو شت كە پێچەوانە و نەیار بن ئەوا زۆربەی جار دەبنە دووجۆر (متناقضین-متضادین) واتە (هاودژ و دژیەك), (متناقضین) تەنها دوو شێوە وەردەگرێت توانای وەرگرتنی شتێكی تری نیە, ئەم شتە وایە و ئەو شتە وانیە واتە باری ئەرێتی و نەرێتی (مثبت و منفی) ئەمانەش تەنها دوانن, بەڵام (متضادین) هەر ئەم دووانە نیە كە سەرچاوەكەی دەبێتە (تضاد), بەڵێ ڕەش و سپی (متضاد)ن بەڵام هەر ئەم دووانە نین بەڵكو سەوزیش, زەردیش, سوریش, ڕەنگ گەلێكی سەرەكی و لاوەكی بێشوومار هەموو ئەمانە (متضاد)ن لەگەڵ ڕەشدا دەیگری لەگەڵ سپیدا دەیگری یەك لەگەڵ یەكتریندا. لەئەنجامدا ئەگەر دوو شتە (متناقض) بوون یەكێكیان نەبوو ئەوا بەدڵنیاییەوە ئەو یەكەكەیانە گومانی تێدانیە یەكێكیان بوو بە دڵنیاییەوە ئەوی تریان نیە واتە نە كۆكردنەوەیان مومكینە, نەدەكرێت

هەردووکیان ببن نەدەکرێت هیچ کامیان نەبن, بەدڵنیاییەوە یەکێك لەو دووانەیە, بەڵام (متضادین) وانیە دەکرێت ڕەشیش نەبێت سپیش نەبێت شتانێکی تر ببێت. مەسەلەی (ئیسلام و کوفر) نە (ئیمان و کوفر) مەسەلەی (ئیسلام و کوفر) دوو (متضاد)ن بەیەکەوە, نە دوو (متناقض), دەکرێت ئیسلامیش نەبێت کوفریش نەبێت شتێکی تر بێت.! بۆچی وایە؟ چونکە کوفر بەرامبەری ئیمانە, ئیمان بریتیە: لە خەصڵەتی خۆشهاتن لەڕاستی, هاوڕابوون لەگەڵ ڕاستیدا, تایبەتمەندیەکەی (پێویستیەکەی) ئاماژە پێدەدەم, و لە بنەماکانیشی یەکێك لە دەستەواژە پڕبایەخ و پڕ خێرەکەی بریتیە لە: خۆشەویستی (محبت), ئیمان لەدڵێکدا هەبوو خەصڵەتی تەسلیم بوون بەڕاستی و عەودالبوونی ڕاستی لەو دڵەدا هەیە, کەواتە (محبت)یش هەیە, هەڵبەتە نەخۆویستانە دەکرێت کەسێکی کافریش عەودالی ڕاستی و هەق بێ, بەڵام دواجار هەر سوودەکەی بۆلای خۆی

دەگەڕێتەوە بۆچی!؟ دەکرێت موحیبەتێکی ببێت بەڵام هەر دواجار سوودیکە بۆ خۆی, چونکە تایبەتمەندی کوفر لەبنەڕەتدا ئەو دوو داواکاریە لەناو دەبات ئەو دوو تایبەتمەندییە لەناو دەبات, تایبەتمەندی کوفر بریتیە لە: لەهەڵهاتن لەڕاستی, ئەوەیە مرۆڤ ئاگایانە لەڕاستی تێبگات, ڕقی لێی بێت و دژایەتی بکات, ئەگەر سەرنج بدەین کوفر لەبنەڕەتدا واتە ئەمە, ئیمانی ڕاست و دروست بەرامبەرەکەیەتی کە ئەوەیە شتێکی بەڕاستی حەزی پێدەکات, پەیوەندیدار دەبێت پێوەی و بەهەر ئەندازەیەك توانای بێت ئەوا هەوڵیشی بۆ دەدات, (کوفر) لەگەڵ ڕاستیدا ناسازگارە-ڕوونکردنەوەکەی درێژە دەکێشێت- بۆچی؟! ئیمان لەگەڵ موحیبەتدا سازگارە, بەڵام ئەگەر خۆشەویستی بێت ئەوە ئیدی هەقویستی نیە و خۆشەویستی نیە, ئەو خۆشەویستیە ئیدی هیچ بەهایەکی نیە لەبەرامبەر ئیسلامەوە هەم (کوفر) دەبێت هەم (نیفاق) یش. زووتر ئیشارەیەکمان پێکردووە (کاتی بوون) دەبێت

له‌مم سیانه‌دا, واته مرۆڤ کاتێك پابه‌ندی ئیسلام نه‌بوو ده‌کرێت (کاتی) بێت که به شێوازی ئاسایی وایه زۆربه‌ی مرۆڤه‌کان له‌م چه‌شنه‌ن, واته ده‌واکاری وه‌حی باش تێنه‌گه‌یشتوون جا ئیتر که‌یفی خۆیه‌تی له‌سه‌ر بتپه‌رستی باوباپیره‌ی په‌روه‌رده بووه له‌سه‌ر مه‌سیحیه‌ت یان یه‌هودیه‌ت ...هتد. ئه‌مانه کاتین, کاتیه به ڕێژه‌ی کاته‌که, واته ماوه‌ی نێوان ناردنی په‌یامی ئیلاهی یان گه‌یشتنی په‌یامی ئیلاهی بۆ مرۆڤ, که مرۆڤه‌کان بێگانه بوون له هه‌قیقه‌تی دین و هیدایه‌تی خودایی. ده‌سته‌ی دووه‌م که کافرن بریتین له‌وه‌ی که له‌به‌رامبه‌ریانه‌وه هه‌قه‌که بڕیار ده‌درێت به ئاگاییه‌وه له‌به‌رامبه‌ریه‌وه ده‌وه‌ستێته‌وه و له‌گه‌ڵیشیدا شه‌ڕ ده‌که‌ن و ڕقیانه لێی, ده‌یانه‌وێت له‌ناوی به‌رن. ده‌سته‌ی سێیه‌میش دووڕوو (منافق)ن هه‌ر حه‌ز ده‌که‌ن به‌وچه‌شنه به‌رده‌وام بن له‌شه‌ڕکردندا به‌ڵام به‌ڕواڵه‌ت مسوڵمانن, که‌واته دژه ئیسلام ده‌بنه سێ ده‌سته و تاقم, نه‌ئه‌وه‌ی هه‌ر که‌سێك موسڵمان

نەبوو ئیدی کافرە, ئەمە یەکێکە لە پوچەڵترین بۆ چوونگەل و خۆویستانەترین و فاسیدترین بۆچوون گەلێکیش کە بەداخەوە زۆر ڕەواجی پێدراوە ئیتر موسڵمانان و لەوانەش زۆربەی زانایانیش وابزانن کە موسڵمان نەبوون ئیدی کافربوونە, ئای چەندێك ئەمە هەڵەیە, چەندێك لەگەڵ ئیسلامدا پێچەوانەیە, چەندێك ناسازگارە لەگەڵ ڕۆحی موسڵمانیدا, کەسێك ڕۆحی موسڵمان بێت دەبێت ئەمجۆرە بۆچوونەی نەبێت. مرۆڤگەل وا حساب نەکات, حسابکردنی خودای باڵا لەگەڵ مرۆڤدا جیاوازە, ئەگەر ئەوە باسی ئەمە بکەم و ئایاتی قورئانی بۆ بهێنم و ڕایگەیەنم ئێجگار درێژە دەکێشێت, لە کاتگەلێکی زۆردا باسکراوە, لە چەند کاتێکدا بەیناوبەین هاتووەتە پێش کە لەمبارەیەوە چەند ئایەتێکی جیاوازم ئاماژە پێداوە, ئێستا تەنها ئاماژەیەکی پێدەدەم ناتوانم ڕوونکردنەوەی زێتر بدەم (لیس بأمانیکم ولا أمانی أهل الکتاب) (إن الذین امنوا والذین هادوا والنصارا

والصابرين من امن بالله واليوم الاخر و عمل صالحا فلهم أجر) خیتاب بە موشرکینی مەککە کە هەمیشە لە جموجوڵ و کێشە دروستکردن بوون لەگەڵ ئیسلامدا, (أكفاركم خير من أولائكم أم لكم براءت فى زهر) (إن الذين كفروا من أهل الكتاب والمشركين) و زۆر لەئایەتەکانی قورئان لەمبارەوەن, ئیتر ئەگەر ئێستا تەفسیرەکەی بڵێم ئەوا کاتی زۆری دەوێت مانای سادەی ئایەتەکانیش بڵێم هەر درێژە دەکێشێت بۆیە پێویست ناکات, بۆ کەسانێك کە شارەزانین لە قورئان پێویستە بڵێم ئەمەیە, قورئان وا نالێت وا نافەرمووێت بەهەشت و دۆزەخیش بەو حیسابەیە کێ موسڵمانە و کێ موسڵمان نیە, هەروەها نالێت هەر کەس موسڵمان نەبوو ئیدی کافرە بە موشرکینی مەککە نالێت ئێوە کافرن, فەرمووی (کافرەکانتان ئەی موشرکینی مەککە) کە گەورەکانتان بوون واتە یەکە یەکە لەناو ئێوەدا هەن کە خەریکن بەرەو بەدبەختیتان دەبەن وریای خۆتان بن, مەکەونە شوێن کافرەکانتان,

بەخودی بتپەرستەکان دەفەرموویّت ئاگاداریان دەکات لەمەککەدا نەکەونە شویّن کافرەکانیان, ئەمە پوختەی داواکاریەکەیە کە کەسیّکیش شارەزابیّت لە قورئان و لیّی بکۆلّیّتەوە و ئایاتەکان دەدۆزیّتەوە, سەرنج بدەن چی دەلّیّم, بەلّام هەر لەم پوختەی ڕوونکردنەوەدایە لە بارەی ئەم سیّ دەستە غەیرە موسلّمانە کە پیّشتر ئاماژەمان پیّدان, کوفر بریتی بوو لەوەی: لەحەق حالّی ببیت و بەئاگاییەوە لە بەرامبەریەوە بوەستیتەوە. ئەمە پلە و رادەی هەیە و هیچ کام لە ئیّمەش دلّنیا نین کە کام لەئیّمە لە موسلّمانان ئەم خەصلّەتە کوفرەیەمان تیا نەبیّت, کە لە بەرامبەر هەقەوە بووەستیت, بەلّکو بە ئەگەر و ئیحتیمال لە هەمووماندا هەیە بە ئەندازەیەکی کەم یان زیاد. خەریکی شەڕە قسەم لەگەلّ کەسیّکدا خۆویستن گرِی سەندووە و (جدل) گرِی سەندووە کابرا قسەی هەق دەکات ئیّجگار کیّشەیە خەسلّتی ئیمان لەمندا ئەوەندە بەهیّز بیّت یەکسەر بلّیّم دروست بوو قسەکەی تۆ راستە. فلّان کابرا لەگەلّ

منداڵێکدا, حاڵه‌تی میهره‌بانی و په‌روه‌رده‌کردنی هه‌یه بۆ منداڵه‌کانی دروسته بزوێنه‌ره‌که‌ی بزوێنه‌رێکی خه‌یره, به‌ڵام ده‌بێته شه‌ڕه قسه یان منداڵه‌که قسه‌یه‌کی هه‌ق ده‌کات, به‌هه‌ر به‌ڵگه‌یه‌ك له‌به‌ر خۆویستی یان له‌به‌رئه‌وه‌ی سامی باوکایه‌تی نه‌شکێت, یان له‌به‌ر ئه‌وه‌ی بنه‌ڕه‌تی بابه‌ته‌که‌ی که وتویه‌تی به‌تاڵ نه‌بێته‌وه سه‌یرده‌که‌یت له به‌رامبه‌ر هه‌قێکه‌وه که منداڵه‌که‌ی وتویه‌تی دژایه‌تی ده‌کات. ئه‌و پیاوانه‌ی که خه‌یاڵ و وێنایه‌کی به‌تاڵ و پوچی وه‌هایان هه‌یه و ده‌زانن پیاو زیاتره له ژن و ده‌بێت مافی جیاوازیان ببێت, ده‌توانێت ئه‌م داخورێت به‌سه‌ر ئه‌ودا ئه‌مر و نه‌هی بکات هه‌رچی بڵێت هه‌ر ملکه‌چیه‌کی لێ داوابکات بیکات ئیدی هه‌ق بێت یان نا هه‌ق, ژن به‌که‌م و عه‌یبدار بزانێت له‌ئاست پیاو و پیاو به کامڵتر ده‌زانێت. مرۆڤێك ئه‌م بیرکردنه‌وانه‌ی هه‌بێت, ده‌ڵێت به شێوازی ئاسایی نابێت ته‌سلیم ببێت له به‌رامبه‌ر ژنیه‌و, ژنه‌که‌ی هه‌قێکی ووت به‌رامبه‌ری

دژایه‌تی ده‌كات, ئیمانداریشه و موسڵمانیشه سه‌نجی ئه‌وه نادات كه ته‌نها پله و ده‌ره‌جه‌یه‌ك كه پیاو هه‌یه‌تی قه‌وامیه‌ته كه ئه‌ویش ته‌نها به‌ڕێوبردنی گشتی ماڵه و ئه‌گه‌ر نا (ولهن مثل الذی علیهن) به‌ر له دیاریكردنی ئه‌و پله‌یه قورئان وا ده‌فه‌رموویێت (لهن مثل الذی علیهم) هه‌موو ئه‌و ئه‌ركانه‌ی كه ئه‌مان هه‌یانه ئه‌وانیش به هامان چه‌شنه هه‌یانه و به‌ته‌واوه‌تی یه‌كسانن (إنهم لباس لكم و أنتم لباس لهن) به‌ڵام ئه‌وه به‌رژه‌وه‌ندی وپه‌یوه‌ندی كۆمه‌ڵایه‌تی خێزانه كه پیاو (قوام) بێت هه‌ر وه‌ك له‌ماڵدا ئه‌گه‌ر لێك تێگه‌یشتن له نێوان ژن و پیاودا هه‌بێت پیاو مافی نیه (سته‌مكاری) بكات و ده‌ستوه‌ردان بكات له باره‌ی چێشتخانه و چێشت لێنان له‌ماڵدا, ئه‌وه كارێكه ڕاسته‌وخۆ به ژنه‌وه په‌یوه‌ندیداره هه‌ڵبه‌ت ئه‌گه‌ر هه‌ردووكیان له هه‌ر كاتێكدا به‌وجۆره‌ی كه قورئان ده‌فه‌رموێت ده‌شێت به ڕاوێژ و متمانه‌پێكردن بێت.

به‌ڵام به هه‌رحاڵ مافێكی دیاریكراویان هه‌یه, ئه‌م ماف دیاریكردنه مانای ئه‌وه نیه له‌هه‌موو بابه‌تێكدا مافێك زیاتر هه‌یه بۆ پیاو یان به‌پێچه‌وانه‌وه, نه‌خێر له ماف و ئه‌ركدا یه‌كسانن, هه‌تا به ڕێژه‌ی توانا و مه‌رجێك بێت كه خودایی بێت, جا مه‌به‌ستم ئه‌وه بوو ئێجگار كه‌من له پیاوانی به ئیمان و موسڵمان كه ئه‌گه‌ر شه‌ڕه قسه‌ی بوو له‌گه‌ڵ ژنه‌كه‌یدا, چونكه ئه‌و بیركردنه‌وه به‌تاڵانه له زیهنی پیاواندا هه‌یه كه پێشترن له ژن و ژن به‌كه‌م عه‌قڵ و كه‌م دین ده‌زانن به‌و ڕیوایه‌ته به‌تاڵانه. هه‌ر كه‌سێك له‌ناو شه‌ڕه قسه‌دا ژن هه‌قێكی ووت ته‌سلیم ببێت ئه‌وا كه‌مه, ئه‌مه تایبه‌تمه‌ندیه‌كه له هه‌موو مرۆڤدا هه‌یه له‌ڕاستیدا ئه‌گه‌ر مرۆڤێك پاك بووبێته‌وه و ڕۆچوو بێت له ئیماندا وه‌ك پێغه‌مبه‌ران و پیاوچاكان كه مرۆڤ گه‌لێكی زۆر گه‌وره‌ن و هیچ تایبه‌تمه‌ندیه‌كی كوفریان تێدا نه‌ماوه, ئه‌گه‌ر من پاڵپشتیم له هه‌قێك نه‌كرد و یان به‌رامبه‌ر به هه‌قێك وه‌ستام و بێ موحیبه‌تیم كرد ئه‌مه تایبه‌تمه‌ندی كوفره له

مندا داگیرساوە و ژەهری دروستکردووە, هەرچی مرۆڤە بە جۆرێکی ئاسایی تیایاندا هەیە, هەر بەو شێوەیەش لەوانە وا ئێمە بە ئەهلی ئیسلامیان نازانین یان تەنانەت بە ئەهلی ئیمانیان نازانین (ئیمانی ئیلاهی) واتە خواپەرستنین (مولحد)ن تایبەتمەندی ئیمان دەبینین, دەبینین ئەگەر ڕاستێکیش کە هیچ بەرژەوەندیەکی خۆی تێدا نەبێت بیبیستێت بەمەرجێك نەگەیشتبێتە حالەتی جیدال و گەرم بوون و خۆویستی تەسلیم دەبێت و وەریدەگرێت, ئەم تایبەتمەندیە لە مرۆڤ گەلێکدا کە مولحیدن زۆر دەبینین موحیبەتیان هەیە و موحیبەتەکەشیان هی لایەنێکی خۆویستی نییە, بۆ ئەم هاوەڵانە نموونەیەك کە گێڕاومەتەوە ئەوەیە کە یەکێك لەو کەسانەی کە من بەبنەڕەت و بنەمای سەرەکی کوفرم دەزانی لە ئێراندا ئەم تایبەتمەندیەم تێدا بینیووە تایبەتمەندی کوفرنیە, بەڵکو تایبەتمەندی ئیمانە, بەمە دەردەکەوێت مرۆڤێك تەواو پاك بوو بێتەوە لە ئیمان یەکجار نایاب و دانسقەیە,

بەرامبەرەکەی مرۆڤێکیش یەکجار پاك بوو بێتەوە لە کوفر یەکجار نایابە. کافریش بە کەسێك دەووترێت کە بەڕاستی پاك بووبێتەوە لەوە رگرتنی هەق, گەییووەتە ئەو ڕادەیەی کە دڵی ئامادەگی وەرگرتنی هەقی نەما بێت, مەگەر لەبەر ئەم خۆویستیە کە دەیڵێم ئەوە هیچ نرخێکی نیە برِواداری واقعی ئەوەیە کە خەصڵەتگەلی کوفری تیا نەمێنێت ئەوەیە برِواداری هەستیار و بە زاراوەیەك کە هەیانە ئەهلی ئەدەبیات بێت, کاتێك لەفزێك دەوترێت مەبەست مانا تەواوەکەیەتی ئەگەر بەو مانا بووترێت بەڵێ برِواداریش ئەوەیە کە ئەو تایبەتمەندیە نەفیکراوەی کوفری تیا نەبێت, کافریش ئەوەیە کە ئەو تایبەتمەندیە (مثبت)ە ئیمانیەی تیا نەبێت, بەڵام گەرچی لە بارەی عاتیفی و (محبت)ەوە برِواداران بە لاوازیش دەوترێت, بەڵام ئەو بارە کە چوون باری (شدَە) بەڕوونی بە کەسانێك مافیان بە تەواوی بۆ ڕوون بووبێتەوە بەرامبەریان نەوەستێت بەهیچ شێوەیەك دروست نیە پێی بووترێت

كافر ناپاكیه به دین و لادانه له زاراوه‌ی قورئان, كاتێك به كه‌سێك ده‌وترێت كافر به‌ته‌واوی و به‌ڕوونیه‌وه ڕاستی به گشتی نه‌ك به‌شێك له ڕاستی بێت كه هیچ كاممان ناتوانین به‌ری بین له‌وه حه‌ق به‌ته‌واوی مانای حه‌قانیه‌ته‌وه و به ته‌واوی پاكی و دروستیه‌وه ناسیبێتی و له به‌رامبه‌ریه‌وه بووه‌ستێت, ئه‌مانه یه‌كه یه‌كه‌ن هه‌میشه, له كاتێكدا كه مه‌رجه‌كه به‌جێ بێت كه چیه و هه‌قه‌كه پیشانبدرێت, كه‌واته ئێستا له‌هیچ شوێنێكی دنیادا حه‌ق به‌ته‌واوی پیشان نادرێت. نازانم كام له ئێوه بیستبێتان ئه‌و سه‌رده‌مانه زۆر ده‌یانووت له سه‌رده‌می شۆڕشدا منی زۆر ده‌شڵه‌ژاند, ده‌یانووت: ئیجازه بده ئه‌م گرووپه خۆ كافرن و با له به‌رامبه‌ریانه‌وه شه‌ڕ بكه‌ین؟ زۆر ڕوونكردنه‌وه‌م ده‌كرد بۆیان كه هه‌یه له‌ناو ئه‌مانه‌دا به ڕاستی وا ده‌زانێت ئێمه خیانه‌ت ده‌كه‌ین له میلله‌ت و له‌به‌رئه‌وه دژایه‌تیمان ده‌كات له‌به‌رئه‌وه لایه‌نگرمان ئه‌شكه‌نجه ده‌دات زینده به‌چاڵ ده‌كات, هه‌رچیه‌ك ده‌كه‌ن وا

کردیان, دەی کەوا بێت عیبادەت دەکەن, من کەسێك کە خەریکە ناپاك لەناو دەبات چۆن دەتوانم بەناوی دینەوە حوکمی کوشتنی بدەم, ئەوە بوو ڕوونکردنەوەم دەکرد بۆیان دەمووت براکان شەڕبکەین لەگەڵیاندا بکوژین هەر قاتڵین بمرین و بکوژرێین هەر قاتڵین, ئایا ڕاستە من بانگەشە بکەم یان هەریەك لە ئێمە بانگەشە بکەین بڵێین ئیسلاممان بە ڕوونی بە تەواوی هەروەك جەوهەری خۆی و بەوشێوە ڕاستەیەوە کە هەیەتی ناساندوە بەکەسێك و ئەو کەسە لەبەرامبەریەوە وەستا؟ مەگەر جارێك لە چەند دانیشتنێکی زۆر دیاریکراو کەم هاتبێتە پێشەوە ئەویش دیاریکراو, بەڕاستی لەهەندێك سوچەوە و لە هەموو ئاڕاستەیەکەوە ئەوە کاتی دەوێت, ڕۆژ و دوو ڕۆژ و دە ڕۆژ حەقیێکی کامڵ و شامل وەك دین ڕوون ناکرێتەوە بۆ خەڵکی, زەمەنێکی زۆری دەوێت, نە ئێمە و نە هیچ کام لە بزووتنەوە ئیسلامیەکان توانای ئەوەمان نیە, یەکەم: باش تێبگەین لێی هەزار هەڵەمان هەیە دروست

تێناگەین لێی. دووەم: ئەگەر باشیش تێگەیشتین باشی بەیان بکەین و پێشکەشی بکەین بەخەڵك. دوای ئەوەش مەرجی سێهەم: مرۆڤ دەبێت خۆی نموونە بێت بۆ ئەوەی کە دەیلێیت. بەو مەرجە کە ئەم کابرا ببێتە کافر, ئەوەیە کە لەپێشدا حەقەکە بەتەواوی ئەدا کرابێت بەپاکی و بەچاکی هیچ نادیاری و ئیبهامێکی تێدا نەبێت وا بێت بە گشتگیری لە ناو خەڵکدا و دەیلێیت بەڵام لەوانەیە کەمتر سەرنجی ماناکەی بدەن بەڵگەکان تەواو بن بۆی واتە چی؟ واتە تەواو ئاشکرا بێت بۆی ئەمە حەقە کە قورئان دەفەرموویێت (کانوا مستبصرین) وەك ئەوەی کە ئیتر گەیشتووەتە ئاشکراییەك وەك حاڵەتی چاو بینین وای لێهاتبێت وەك ئەوەی ببینین, بەمجۆرەی لێبێت پاشان دژایەتی بکات لەگەڵیدا, ئەوکات دەبێتە کافر, کەواتە مەرجە کە بەجێ نایەت ئالەم ڕۆژگارەدا, کاتێك مەرجەکە بەجێ نەهات بەدیهیە ئەو دەسکەوتەی کە بریتیە لەوە هەرکەس لە بەرامبەریەوە وەستا ببێتە کافر

ئەویش بەدی نایەت, بەڵام ئەوەی کە ئێوە لە بەرامبەریەوە هێناتان شەرگەلێك لەزەمانی پێغەمبەر (د.خ) یان لە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشیدیندا, لەگەڵ ئەوانەی وا لە ناوەوەدا بە تایبەت لەسەردەمی خەلیفە ئەبوبەکری صدیقدا بەرامبەری وەستان لە هەندێك ئەحکامی ئیسلامدا, ئەمە بابەتێکە کە ئێجگار زۆرتر لەمەش پێویستی بەڕوونکردنەوە و لەسەر رۆیشتن هەیە, ئەمە ناونیشانی گشتی سیاسەتی نێونەتەوەیی ئیسلامە, کە بریتیە لەوەی ئیسلام پەیوەندی لەگەڵ غەیرە ئیسلام چۆنە, حکومەتی ئیسلامی پەیوەندی لەگەڵ حکومەتی نائیسلامیدا چۆنە. لە ناوباسەکەمدا ئاماژەیەکم کرد کە لەبنەڕەتدا جەنگ لە نێوان کوفر و ئیسلامدا بوونی نیە بەهیچ شێوازێك, واتە ئیسلام شەڕ ناکات لەگەڵ کەسێکدا یان کۆمەڵگەیەکدا لەبەر ئەوە تۆ کافری هەتا ناموسڵمانیش کافریش بەواتا بنەڕەتیەکەی دەڵێم واتە تەواو لە حەق تێگەیشتبێت و لە بەرامبەریشدا بوەستێت,

ئەو کافرەی کە یەکجار کەمە کەئێستا هەر نیە لەدونیادا دڵنیام تەنها کافرێك پەیدا نابێت, چونکە ئیسلامێکی دروست پێشکەش نەکراوە و نەحراوەتە پێش چاو. ئەگەر کافر ئاوەهاش بێت کۆمەڵگەیەکیش کۆمەڵگەی کوفر بێت, بۆ کۆمەڵگەی کوفر بێت؟ ئەوەیە گەورەکانیان دژایەتی ئیسلام دەکەن لەشکریش لەخەڵکیش دروست دەکەن, خۆ پێویست ناکات تاکەکانی لەشکرەکەی کافر بن. بەڵام ئەوانەی وا لەسەر کوفر شەڕ دەکەن ئیدی لە ژێر ناونیشانی کوفردا حیسابیان بۆ دەکرێت, ئەگەر شتێك بەو جۆرە و کافرێکیش بەو مانا دروستە بوونی هەبێت خۆ ئیسلام لەگەڵ ئەودا شەڕ ناکات. لە ڕاستیدا شتێکی وەها بوونی نیە بیستووتانە هەر بەو زاراوەیە وا بەغەیرە موسوڵمان دەڵێن کافر, کە ئەمەش زۆر هەڵەیە (غەیرە موسوڵمان گشتیە و کافر تایبەتیە), بەڵام بە هەرچی غەیرە موسوڵمان هەیە دەڵێن کافر ئەم سێ زاراوە بەناوبانگە لەناو خەڵکیدا کافری جەنگی یان (محارب), کافری (زیمی),

کافری (معاهد), کافری معاهد زۆر ناسراو نیە بەڵام ئەم دووانەیان زۆر ناسراون (کافری جەنگی و کافری زیمی) جا ئێستا کارم بەوەی ئەو نیە کە ڕاستیدا لە فزی کوفرە کە لەبەکاربردندا هەڵەیە, غەیرە موسڵمان دەبنە ئەم سێ دەستەوە, چ کافر چ غەیرە کافر دەبنە سێ دەستە یەکەم حەربی: ئەوەی کە جەنگ دەکات لەگەڵ ئیسلامدا. دووەم زیمی: ئەوەی کە لەسەرزەمینی ئیسلامدایە. سێهەم معاهد: ئەوەی کە وڵات و سەرزەمینی سەربەخۆیە و جەنگ ناکات لەگەڵ ئیسلامدا بەڵکو پەیمان دەبەستێت ئیدی پەیمان لە هەر دەرەجەیەك و پلەیەکدا بێت, پەیمانەکانی وەك (نەبوونی دوژمنایەتی) سادەترین و تەنانەت لەوەش سادەتر (نەبوونی جەنگ) ئەمە ئیتر سادەترین و دیاریکراوترین چەمکی پەیمانەکانی نێونەتەوەییە, شەڕمان نەبێت بەیەکەوە تا دەگەیتە پەیمانگەلێکی هاوکاری و لە چالاکی سەربازیدا بەیەکەوەبوون...هتد. کەواتە هەر خودی ئەم زاراوەیە کە دەڵێن کافر

ئەم سێ دەستەیەن یان دروست تر بڵێین ناموسڵمان ئەم سێ دەستەیەن. ئەم بەڵگەیە کە لەگەڵ کوفردا شەڕ نیە ئەگەر نا چۆن (زیمی)یە ئەگەر نا چۆن (معاهد)ە لەگەڵ غەیرە موسڵمانیشدا شەڕی نیە لەگەڵ کوفریشدا هەر شەڕ نیە, لە ڕاستیدا غەیرە موسڵمان ئەمەیە بەڵام مەبەست ئەوەیە تەنانەت بەو زاراوەیەش کە بڵێین کافر, بە ڕاستەقینەش کابرا کافر بێت بەرەکەش بەرەی کوفر بێت. باشتر وایە بڵێین ناوچە بانەڵێین بەرە چونکە بەرە زاراوەیەکی سەربازیە, ناوچە ناوچەی کوفر بێت ئیسلام لەگەڵیدا شەڕی نیە بەو پێیەی کە لەگەڵ ئەودا دەکرێت پەیوەندی هەبێت ئەگەر لەسەر زەوی ئیسلامیشدا نیە پەیوەندی (معاهد) بێت کەواتە شەڕ ناکات, کەواتە کاتێك ئێمە دەڵێین پەیوەندی حکومەتی ئیسلام لەگەڵ غەیرە ئیسلامدا چ کوفر چ غەیرە کوفر سێ شێوەیە کەواتە ئەوەی کە وێنای دەکەین و دەڵێین لەگەڵ ئەو لایەنە کافرانەدا موسڵمانان و ئیسلام شەڕیانە لەگەڵیدا ئەمە بەتاڵ بوویەوە,

دروستە؟ سێ شێوە پەیوەندی هەیە بەڵام قورئان ئەمانەشی بەیان کردووە چ کاتێك شەڕە, لەکاتێکدا ئیعلانی شەڕ دەکات کە (قاتلو الذین یقاتلونکم ولا تعتدوا) شەڕ لەگەڵ ئەوانەدا بکەن کە شەڕتان لەگەڵدا دەکەن, بەڵام دەستدرێژی مەکەنە سەر ئەوانەی شەڕناکەن ئێوە خەریکی شەڕ بن (فأنتهوا) تەنانەت دەگەیتە ئەوە تەنانەت خەریکە شەڕ بکات لەگەڵتدا بەڵام (فأنتهوا فلا عدوان الاعلی ألظالمین) ئەگەر ئەو دەستی هەڵگرت لەشەڕ ئیتر تۆ بۆت نیە دووبارە هێرشی بکەیتەوە سەری, مەگەر کاتێك زوڵمت لێدەکات بەدرۆوە دەستی هەڵگرتووە, لە شوێنێکی ترەوە خەریکە زیانت پێ دەگەیەنێت, واتە هێشتا هەر حاڵەتی شەڕی هەیە لەگەڵتدا, شەڕ لەگەڵ ئەوانەدا هەیە, ئەگەر شەڕی نەبوو چ لە ناوەوەی سەرزەمینی ئیسلام بێت کە پێیان دەڵێن (زیمی) چ لەدەرەوەی سەرزەمینی ئیسلامدا بێت لایەنی کەمی ئەوەیە کە حاڵەتی (نەبوونی جەنگ) بێت و شەڕمان نەبێت

بەیەکەوە تاقۆناغ گەلێکی سەرووتر. هەر ئەم سێ زاراوە بەناوبانگە بەسە بۆ ئەوەی مرۆڤی موسڵمان تێبگەیەنرێت کە نەخێر مەسەلەکە وانیە, ئەوەش قورئان و ئایەتی فرە و فراوان, بەڵام ئێستا لێرەدا شتێك بووەتە هۆی هەڵەی هەندێك لەموفسرین و هەروەها وەرگێڕەکانیش کە هەڵە بکەن و سەیریش نیە تەرجومە و وەرگێڕان و توانای گەیاندن و توانای قورئانی نیە لەبارەی سورەی (براء)دا ئەو وێنایە پەیدابووە کە لە بنەڕەتدا لەگەڵ موشریکینی مەککەدا نەك باقی موشریکینی جیهان لەگەڵ موشریکینی مەککەدا بەبێ مەرج و عەهد و پەیمان نیە, موشرکینی مەککە بەبۆنەیساڵانێکی دوور و درێژی جەنگیانەوە لەگەڵ ئیسلامدا هەمیشە حاڵەتی (محارب)یان وەرگرتووە. نەخێر ئەمەش هەڵەیە تەنانەت بۆ موشریکینی مەککەش وانیە لە سەردەمی خودی پێغەمبەردا (د.خ) کە دەزانین دوای فەتحی مەککە (موشریکی مەککە) واتای نەما, واتە بەر لە فەتحی مەککە ئەمەش هەڵەیە

ته‌فسیرێکی هه‌ڵه‌یه‌ بۆ قورئان, به‌ڵام سوره‌ی (براء ) وا نافه‌رمووێت وه‌ك له‌ ڕوخساری ئایه‌ته‌که‌دا دیاره‌, یه‌کێك له‌ کێشه‌ی سه‌ره‌کی موفه‌سیرین ئه‌وه‌یه‌ هه‌ر خه‌ریکی ئایه‌تێکن, ئیدی ئاگایان له‌باقی قورئان نیه‌ هه‌ر له‌ سوره‌ی (براء) و ئه‌وی دیکه‌ی ئاگایان لێ نیه‌ (براء من الله ورسوله الی الذین عاهدتم من المشرکین) روخساری ئایه‌ته‌که‌ له‌سه‌ره‌تاوه‌ ئه‌م جووملە ڕاده‌گه‌یه‌نێت. له‌لایه‌ن خوداوه‌ و له‌لایه‌ن پێغه‌مبه‌ری خوداوه‌ (د.خ), (برائت) ڕاده‌گه‌یه‌نرێت له‌گه‌ڵ ئه‌وانه‌دا و په‌یمانیان له‌گه‌ڵ به‌ستراوه‌ له‌موشرکینی مه‌ککه‌دا, له‌وه‌و دوا باقی ئایه‌تی سوره‌ (براء ) ته‌نانه‌ت تاکۆتایی سوره‌تی (براء) چه‌ند به‌شێکی جیاواز به‌ چه‌ند ئاماژه‌یه‌کی جیاواز به‌ڵام تا پانزه‌ شانزه‌ ئایه‌ت ڕوونکردنه‌وه‌ی ئه‌م ناونیشانه‌یه‌, هیچ سه‌رنجی ئه‌وه‌ ناده‌ن که‌ دووجار له‌قورئاندا ناواز (استثناء ) ده‌فه‌رمووێت. هه‌ر له‌خودی ئه‌و پانزه‌ شانزه‌ ئایاته‌دا, که‌متر له‌ پانزه‌ و شانزه‌ ئایه‌تیشه‌

هەر لەو ماوە کورتەدا دووجار ناواز (استثناء) دەفەرمووێت, مەگەر ئەو کەسانە کەجێگیر بوون لەسەر بەڵێن و پەیمانیان یەکێکیان ناو نیشانیشیان دەدات کە کام بەڵێن و پەیمان بوو (الذين عاهدتم عند المسجد الحرام فان استقاموا لكم فستقيمو اليهم) کە گرووپێك بوون لەگەڵ ئیسلامدا پەیمانیان لەنزیك مەسجیدولحەرامدا بەست, ئەوانە خودای گەورە جیایان دەکاتەوە. تاکاتێك ئەوان جێگیرن لەسەر بەڵێن و پەیمانی خۆیان ئێوەش جێگیربن, ئەو ناونیشانەی یەکەم دەبینین هەندێك لە موفەسیرین, کەواتە دەڵێن ئەمە ڕاگەیاندنی گشتیە بۆ تەواوی موشریکینی مەککە (فسيروا فی الأرض اربعة اشهر) تاچوار مانگ مۆڵەتیانە دوای چوار مانگ هەرچی پەیمانە بەتاڵە, سەرنجی ئەوە نادەن ئاخر وانیە. هەر ئەمەش بڵێ موشریکینی مەککە سەیر نیە کە مرۆڤ ئەو هەموو غەدر و نادروست گەلەیان لێدەبینێت لەدرێژایی چەند ساڵ بەرامبەر

وەستانیان لەگەڵ ئیسلامدا ئەو هەموو پەیمان شکاندنە سەرسوڕهێنەرنیە بووترێت. کەوا بێت ئیتر پەیمانیان ئیعتیباری نیە, هەمووی پوچەڵە بەڵام هێشتاش قورئان ئەوە ڕاناگەیەنێت, نافەرموویێت لەگەڵ موشریکینی مەککەدا بەو هەموو پێشینەوە هەرچی پەیمانیانە بەتاڵە, ئەوانە وا جێگیرن لەسەرپەیمان پەیمانیان بەرێزە, با لەمەگەڕێین ئەمە باسێکە زۆر درێژە و هەر لەم مەسەلەی سیاسەتی نێونەتەوەییە کە ئاماژەم پێکرد, لە گشت ئەوەدا وا ئێمە لەقورئاندا دەستمان دەکەوێت و لەخوێندنەوەی دروست و هەڵگۆزین لە خوێندنەوە لەمێژووی ئیسلامدا ئەوەیە کە ئیسلام لەشەڕ لەگەڵ کۆمەڵگەیەکدا دەکات کە دژایەتی و شەڕی دەکات لە پەیوەندی نێونەتەوەییدا و مەبەستم ناوخۆیی نیە. لەبەرامبەر کرمەڵگەیەکەوە کە ئازادی دادەماڵێت لە موسڵمانان کە ئەوەتان لەسەرزەمینێکدا کە سەرزەمینی ئیسلام نیە و مەملەکەتێکی ترە.

ئەگەر بەزاراوەی ئەمڕۆ بیلێیت مەملەکەت, هەرچەندە لە ئیسلامدا گۆی زەوی وەها دابەش نەکراوە وەها دابەشکردنێکی بێویژدانانە و زاڵمانە و دژە مرۆڤانە ناکرێت ئەمانە بەڕاستی دژی مرۆڤایەتیە و بەڕاستی هەتکی مرۆڤایەتیە, ئەم سنوورگەلە گەورەترین هەتکە بە ئیسلام هەروەك ئەوەیە دیوارێك کابرا کێشاویەتی بەدەوری گەورەکەیدا ئەم پەزگەلە هی منە, حکومەتگەل هەروەك دیوارێکی وەهای کێشاوە ئەم پەزگەلە ئەم میللەتە هی منە. ئەمانە زۆر مرۆڤایەتی سووك دەکەن, وانیە مەملەکەت واتای نیە لە ئیسلامدا, لەناوچەیەکدا کەسەر زەمینی ئیسلام نیە حکومەتی ئیسلامی نیە حکومەتی غەیرە ئیسلامیە چ کافر بن چ کافر نەبن, غەیرە موسڵمان, بیانەوێت دژایەتی موسڵمانان بکەن کە ئەوەتان لە سەرزەمینی ئەواندا هەروەك ئەوە کە دەیبینی لەدونیادا کە هەر قوتابخانەیەك سەبارەت بەپەیڕەوانی خۆی یەك بەرپرسیاریەتی هەیە, ئەو پەیڕەوانە لە

سەرزەمینی خۆیاندا بن یان لەشوێنێکی تردا بەمەرجێك کە دراوسێی سەرزەمینی ئیسلام بن (قاتلوا الذین یلونکم) بەو مەرجە ئەگەر ئەو ناوچەیە دراوسێی سەرزەمینی ئیسلام بوون, موسڵمانانی ئەو ناوچە لەژێر گوشار و ئازاردا بوون ناچاریان بکەن بەوەی تەرکی ئیسلام بکەن ئەوکاتە ناوچەی ئیسلام سەرزەمینی ئیسلام دوبارە جەنگی لەگەڵدا دەکات. ئەمە دوو جۆر, یان ئەوەیە شەڕی لەگەڵدا دەکات یەکێك لەوانە ئەوەیە کەفشار دێنن, چونکە ئەویش هەر شەڕە لەڕاستیدا, فشار دێنن بۆ موسڵمانان بەمەرجێك دراوسێ بن ئەگەرنا بۆشایی کەوتبێتە نێوانیان بۆی نیە چونکە ئەو کاتە مافی خەڵکی تر پێشێل دەکات. تۆ مافت نیە لەناوچەیەکدا کە لەحاڵەتی جەنگی ئاشکرادا وەك ئەوەی شمشێر بکێشێت و بێتە مەیدان یان جەنگی دەرونی یان (مەعنەوی), وەك ئەوەی فشار دێنێت بۆ موسڵمانان ناوچەکەی پێشێل بکەیت و

بڕۆیت لەگەڵ لایەنێکی تردا شەڕبکەیت, ئاشوب و ئاژاوە بکشێتە نێو جێگەکانی تر, بەمەرجێك ئەگەر دراوسێ بوون وەهایە ئەگەر نا دەبێت موسڵمانان هەستن لەناوچە دوورەکاندا لەوێ نەمێنن لەژێر فشاردا بێنە دەرەوە, هیجرەت هەمیشە حوکمی بەڕێزە لە ئیسلامدا بەمەرجێك هەمان ئەم هەواڵ و دەنگوباسانەیان هەبێت هەستن بێنە دەرەوە, ئەمە دوو جۆرە جەنگ, لە پەیوەندی نێونەتەوەییدا لەگەڵ غەیرە موسڵماندا, جۆرێکی تریش شەڕمان هەیە شەڕی ناوخۆییە, کە ئەوەیە ئاماژەتان پێکرد لە پرسیارەکەدا, جەنگی نێوان خەلیفە ئەبوبەکری صدیق و ئەهلی (ڕەدە)دا شەڕی ناوخۆیی حوکمەکەی ئەوەیە لەقورئاندا کە بەناونیشانی (محاربین) ناو دەبرێت زۆریش بێسنوور تەفسیری هەڵەتوپەڵەتی بۆ دەکرێت ئەوانەی وا لەسەرزەمینی ئیسلامدان ئەهلی بەیعەتی ئیسلامین قەول و قەراریان بەستووە. بەپێی (دیسپلینی) ئیسلامی بژین ئەگەر دژایەتیان

کرد لەگەڵ ئیسلامدا لە بەرامبەر ئیسلامدا وەستان ئەمان وەك ئەوانی تر نین وەك ئەوانەی وا لە ناوچەکانی تری ئیسلامیدا هەن نین, ئەمان حوکمیان جیاوازە حوکمیشیان چەند دەرەجەیەکی جیاوازی هەیە, زۆر و زەبەنە یەك قۆناغی بریتیە لەوە لەمەیدانی جەنگدا بکوژرێن, واتە پێیان ڕادەگەیەنرێت ئیسلامێك کە ئێوە بەڵێن و پەیمانتان لەگەڵ بەستووە ئەمەیە حەزرەتی ئەبوبەکر نافەرموێت بڕۆن بیانکوژن فەرمووی بڕۆن ئیسلامیان پێڕاگەیەنن, یان شەڕ دەکەن لەگەڵتاندا یان قبوڵی دەکەن, سەرنج دەدەیت؟ مەسەلە ئەوە نیە بڕۆن خەڵك بکوژن, بەڵکو بڕۆن ئیسلامیان پێ ڕابگەیەنن, یان شەڕ دەکەن یان تەسلیم دەبن ئەگەر تەسلیم ببن ئەوا ئیتر شەڕێك ڕوونادات ئیتر کوشت و کوشتار نیە, بەڵام ئەگەر شەڕیان کرد و هاتنە مەیدان بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵتاندا ئەوکات چوار حوکم دێتە کایەوە, یەکەم: ئەوانە کەوا هێشتا ئەوەتان لەمەیدانی جەنگدا هێشتا دەست

هەڵناگرن لەجەنگ بەبۆنەی ئەم بابەتانەوە ئەوا جەنگ بکەن لەگەڵیاندا مەڵێن ئەمە کوڕی پیاو چاکێکە و ئەوە لە پێشینەکانە و ئەو پەیڕەوی لە فلان کەس کردووە شمشێر هەڵدەکێشێت مەگەر ژن بێت یان پیرێکی نەتوان بێت یان منداڵ بێت یان ئەوانەی لە ئیسلامدا دەست نیشانکراون کە شەڕیان لەگەڵدا نەکرێت, ئەگەرنا شەڕ بکەن لەگەڵیاندا و بیانکوژن. دووەم: ئەوانەی دەستگیر دەکرێن, ئەو کەسانە کەوا شەڕیان کردووە خەڵکیان کوشتووە بیاندەن لەدار. سێهەم: ئەگەر خەڵکیان نەکوشتووە, خەڵکیان کەمئەندام کردووە (سەر, دەست, چاو...هتد) دەست و پێیان ببڕن. چوارەم: ئەگەر ئەمەیان نەکردووە بەڵام ئاژاوەیان هێناوەتە کایەوە ئازار و گوشاریان خستووەتە سەر خەڵك دوور بخرێنەوە (تبعید) لەشوێنەکەی خۆیان نەهێڵرێن. ئەم چوار حوکمە بۆ ئەو کەسانەیە کە لەناوخۆی سەرزەمینی ئیسلامیدا هەڵدەسنەوە لە بەرامبەر ئیسلامدا (کوشتن لە مەیدانی

جەنگدا, لەداردان, دەست و پێبڕین, دوورخستنەوە و (تبعید)کردن, بەپێی لایەنەکان بەم پوختەیە کە پێشتریش ئاماژەم پێدا, یاسایە بۆ حەزرەتی ئەبوبەکر بۆ هەر زەمانێکیش سەبارەت بەوانەی کە لەناوخۆدا دەست دەکەن بە دژایەتیکردنی حکومەتی ئیسلامیدا, واتە حکومەتێك بەپێی یاسای ئیسلام ڕەفتار بکات, بەڕاستی حەزرەتی ئەبوبکر بەڵێن و پەیمانی لەسەر ئەوە بوو و هەموومان دەزانین بەڕاستی و ڕاستگۆیانە وەفادار بوون بەرامبەر بەڵێن و پەیمانی خۆیان و بەئیسلام رەفتاری کرد, حکومەتی بەپێی ئیسلام بەڕێوەبرد لەبەرئەوە ئەو هەقی هەیە لەبەرامبەر کەسانێکەوە کە دژایەتی بکەن لە ناوخۆدا لەسیاسەتی ناخۆیدا ئەم بەرنامە کە قورئان دایناوە بەکاری بهێنێت (پێشتر ئاماژەم پێدا کە کافر بوونی نیە) بەشێوەیەکی گشتی ئاماژەم پێدا کە لەبنەڕەتدا شەڕێك بەناوی کوفر و ئیسلامەوە نیە, ئیسلام لەگەڵ کوفردا شەڕی نیە شەڕی ئیسلام ئەم سێ جۆرەیە,

یەکەم: لەگەڵ غەیرە موسڵمانان یان کافران کە شەڕی لەگەڵدا دەکات. دووەم: لەگەڵ غەیرە ئیسلام یان کافردا کە دراوسێ بێت و فشار بخاتە سەر موسڵمانان، موسڵمانان بکوژرێن و ئازار و ئەشکەنجەیان بدات کە ئیسلام بیانگەڕێنێتەوە، کە ئەمە بەڵێ ڕاگەیاندنی شەڕ نیە هێرشبردن نیە بەڵکو واقیعیەتەکەی هەر جەنگە. سێهەم: یاخود لە سیاسەتی ناوخۆییدا لەگەڵ کەسێکدا کە دژایەتی حکومەت و کۆمەڵگە و خەڵك دەکەن، بەپێی دژایەتیکردنەکەیان چۆنە، خەڵك دەکوژن لە مەیدانی شەڕدا، شەڕ دەکرێت لەگەڵیاندا تا دەدۆڕێن دوای ئەوەی شکستیان هێنا ئیتر بێ موراعات بە تەواوی  مانا جەنگە، پاش ئەوەی شکستیان هێنا ئەوانەی کە خەڵکیان کوشتووە لەسێدارە دەدرێن ئەوانەش خەڵکیان کەمئەندام کردووە (دەست، سەر، چاو...هتد) دەست و پێیان دەبڕێت ئەوانەی کە هیچیان نەکردووە بەخەڵك و لەمەیدانی جەنگیشدا بوون بەڵام بواری زیان گەیاندنیان بە خەڵکی

نەبووە یان نەڕەخساوە, دوور دەخرێنەوە (تبعید), تا لەو ناوچەدا دووبارە دەست نەدەنە دەستیەك و ئاشوب و ئاژاوە دروست نەكەنەوە, ببرێنە شوێنێك كە ناوچەی خۆیان نەبێت و توانایان نەمێنێت. بەپێی ئەم دوو بەرنامە یەكێك لەسیاسەتی نێونەتەوەییە لەگەڵ غەیرە موسڵماندا كافر بێت یان غەیرە كافر, كە ئەو شەڕی لەگەڵ كوفردانیە, بەو جۆرەی كە ئاماژەم پێدا شەڕی لەگەڵ كەسانێكدا هەیە كە نەیاری ئیسلامن بەو ڕیزبەندیەی كە وتمان نە لەبەرخودی نەیاریەكەی, بەوەی كە هێرشی بۆ دەبەن یان بەوە كە دراوسێن و ئەشكەنجە و ئازاری موسڵمانان دەدەن شەڕی لەگەڵ ئەوانەدا هەیە ئەگەر ناوبەناو ئەمە كافرە وتمان دەبنە ئەو سێ دەستە (حەربی, زیمی, معاهد) یەكێك لەم سیانەیە. ئەگەر ناوخۆییشە لەگەڵ كەسانێدا دژایەتی دەكەن بەمەرجێك كە هیچ بەڵگەیەكیان نەبێت بۆ ئەوەی حكومەت لایداوە لە ئیسلام, كابرا ئەگەر حەزرەتی عومەر لە بەرگریكردن لە

خۆیدا نەی سەلماندایە کە ئەم کراسەی بەدیاری (عبدالله) کورِیەوە دوو پارچەی گەیاندووەتە یەك و دروستی کردووە ئەمە ناتەواو بوو بۆ حەزرەتی عومەر, دژایەتی کابرا لەگەڵ حەزرەتی عومەردا دژایەتیەکی شەرعیە و بەجێهێنانی وەزیفەیە لەبەر ئەوە بەرامبەر (منکر)دا وەستاوە, ئەو کارەساتانەی کە بیستووتانە, ئەگەر حکومەت (منکر)ێکی کرد ئەوکاتە دژایەتیکردنی جیهادە, عیبادەتە. ئەگەرچیش حکومەتەکە لە سەدا سەد ئیسلامیە بەڵام (منکر)ێکی توش بوو, لەبەر ئەو (منکر)ە دژایەتی کرد ئەوە وەزیفەی بەجێ هێناوە, ئەوە نابێتە شەرِکەر, کاتێك شەرِکەرە (محارب) کە بەڕاستی هەر لەبەر ئەوەی بەپێی ئیسلام رەفتار دەکات دژایەتی دەکات بێ ئەوەی کە رِەخنەیەك بدۆزێتەوە. (منکر)ێکی تێدا نەدۆزیوەتەوە دژایەتی دەکات تەنها لەبەر دژایەتیکردن لەگەڵ ئیسلامدا ئەوەیە پێی دەوترێت شەرِکەری ناوخۆیی (محارب داخلی) شەرِکەر هەر لەموسڵمانان, نە ئەوەی

لە پەیوەندی نێونەتەوەییدا هەیە, لەبەرامبەر ئەوەوە دژایەتی دەکات بەو چوار شێوەیە کە ئاماژەمان پێدا کەواتە ئێستە گوزەرێك بکەین بەسەر مێژووی شەڕەکانی سەردەمی پێغەمبەر (د.خ) ئەوا دەبینین لەبنەڕەتدا مەسەلە شەڕی کوفر و ئیسلام نیە شتێکی وەها بوونی نیە ناونیشانێکی بەم شێوەیە دروست نیە, بەڵکو شەڕی ئیسلامە لەگەڵ غەیری موسڵمانەکاندا چ کافر بێت چ غەیرە کافر بێت بەو شێوازانەی کە وتمان شەڕی ناوخۆییش شەڕێکە بەم شێوەیە کە ڕوونمان کردەوە کە ئەو چوار حوکمە لەخۆ دەگرێت.

